ئەم هەناسە گەرمانەی نێو وەرزەکانی غوربەت و تەنیاییم پێشکەشە بە :

- دایکم
- خولیا و رەها و رەهەند
- مەهدی حەسەن ی هونەرمەند

- تابلۆی بەرگ: هونەرمەند قەرەنی جەمیل
- نەخشەسازی: سەرکەوت وەلی

# لاوکی تەنیایی

( چەمانەوەیەك بۆ بزە گەرمەکانی خولیا )

ئینجانەیەك لەڕووناکیت بۆ جێ هێشتم
تا تاریکی ئازارم نەدات
گەرمایی لەشی خۆتت لەنێو جێگاکەم بەجێ
هێشت
تا تەنیایی خەونەکانم پەرت نەکات
رۆژان ڕۆیشتن گوڵم
وەرزەکان بەسەما هاتن
سپێتی نێو چاوی گەڵاکان زەرد هەڵگەڕان

شەوەکان مردن و بەیانیەکانیش پەرتەوازە بوون
تۆ هەر نەگەڕایتەوە
ئەم سەفەرەت بۆ وا دوورو درێژە درێژ
باڵندەکان کۆچیان کرد و گەڕانەوە
ئەستێرەکان کۆچیان کرد و گەڕانەوە
شەپۆڵەکان کۆچیان کرد و گەڕانەوە
بەتەنها تۆ نەگەڕایتەوە
ئەی کوڵێکە سوورەکانی بنار کەژ و کێوەکانی عەشق
بەتەنها تۆ ...!

بەر لەڕۆیشتنت ,
هێنە لەخۆبایی و بەرزەفڕ بووم
وام دەزانی
سروشت بەڕەنگەکانی ڕوخساری من
کەڤاڵەکانی خۆی ڕەنگ دەکات

**وام دەزانی**

**ئەوە منم / گەردەلوولە گرمۆڵەبووەکانی ئەبەدیەت**

**بەهەناسە دێنم و**

**نەمری بەسنەوبەرەکان دەبەخشم و**

**کوکوختیەکانی دۆزەخیش فێرە فرین دەکەم**

**بەڵام هەیهات و واوەیلا بۆ خۆم**

**ئەی کێڵگە تەڕە هەمیشە سەوزەکەی دڵم**

**ئێستا، پردی سیراتی ئەفسانەکانی رۆحم**

**گەلێك لە موو باریکترە**

**تا ئەو ئارەزوو بکات و**

**تا چاوەکانی مانگ بڕبکەن ... تەنیام**

**تەنیا و تەنیا و تەنیا ...**

**ئەی ئەستێرە ئەسمەرییەکەی بەختم**

**ئەی کاتژمێرە ڕەنگ خۆڵەمێشییەکەی دەستم**

**دە تۆزێك رەحمەت بێ و زوو بگەڕێوە..!**

**بەڵام گوڵە گیان،**

**بەر لەوەی بگەڕێیتەوە**

**برۆ لەنێو چاوەکانی دایکم سەرخەوێ بشکێنە**

**لەپەنجەرەی خەمەکانی بڕوانە**

**دوور دوور بڕوانە دوور**

**لەدەلاقەی یادگارییەکانی منداڵیم بڕوانە**

**موحیبەت و عەشق و تەمەن وا لە وێدا**

**لەنەرمە پیاسەکانی ئێوارانیش**

**هەموو شەقامەکان و کۆلانەکان بەسەر بکەرەوە**

**بۆ دار بەدار و گەڵا گەڵای باخچەی خانزاد بنووشتێوە**

**چیرۆکە ریش سپیە پەپوولەییەکانی**

**کچۆڵە عاشقەکان و**

**خەونە پەمەییە بەرائەتیەکانی منداڵانیش**

**لەشیعرێکدا بۆم بنووسەوەو**

**هەر بڕوانە و هەر بڕوانە و هەربڕوانە**

**دوور دوور دوور  دوور دوور دوور .**

گوڵەگیان،

بەر لەوەی بگەڕێیتەوە

بڕۆ لای ( کەریم دەشتی ) و پێی بڵێ،

ئەوانەی لە مردن سەما دەکەن

وەك من تەنیان

ئیدی لەمەودوا چ قەدەرێك لەئامێزی خۆی

هەڵماندەگرێ و

دەمانگەیەنێتە بەرتەکیە پڕ لەنوورەکەی

مەولەوی و

بخوورێك لەهەیوانی ماڵەکانمان

دادەگیرسێنێ ....!

هەر لەسەر ڕێگای خۆت دا

سەرێکیش لە ڕەزە ڕازاوەکەی

پڕ لەشیعرە کریستالییە ترێییەکانی

( هاشم سەراج )یش بدەو وپێی بڵێ

گەمەی مۆرفیمەکان تەواو بوو

کەف و کوڵی ( ئایس کەپەچینۆ )ش دامرکایەوە

ئیدی لەمەودوا
بەدیار کام سفرە نارنجیەکانی ئەڤینی
دوگمەی ستیانە شەرابییەکەی
مەمکەکانی کام بەیاتریس بترازێنین
پێکەکانمان
لەگەڵ بارینی شەهوەتی گژوگیای کام وەرز
رۆندکەکانی کام شەوی ڤینۆسی، هەڵبدەین
بەمەستی
لەکام ڕازە ڕێواسییە نەرم و شلە وجودییەکانی خەیاڵ
بڕوانین...!؟

گوڵە گیان،

ئەوە منم / باران لە تەنهاییم ئاو دەخواتەوەو

کانیەکانی مردنیش چاو هەڵدێنن

لەحەژمەت ئەم ڕۆیشتنەت

نیگا شەبەنگییەکەی بێداریم

لەمەمکە لیمۆییەکانی خودا ڕادەمێنێ

چرکە چرکە بورژانگە نەرمەکانی تەمەنم هەڵدەوەرێ

چرکە چرکە بەفری لوتکە و گردۆڵکەکانی ئارامیم

بەخۆرەتاوی عەشقی تۆ دەتوێتەوە

چرکە چرکە سەمفۆنیای یاد و بزە گەرمەکانی تۆ

شەیداتر و سەروەرتر و تەنیاترم دەکات

گوڵە گیان،

ئەی شیلەی گوڵە شلێریەکانی نێو بەهەشتی شیعرەکانم

دەتۆزێك ڕەحمەت بێ و

زوو بگەڕێوە زوو ...!

کەنەدا / ئۆگستی 2005

تیمۆرتنی (Main & Wentworth)

کاتژمێر 3.35 دەقیقەی بەیانی

# کاتژمێری ڕەنگەکان

**لە کوێی ئەم گۆی زەمینە وەستاوین ...؟**
**کام ئاوێنە لەفڕینەکانمان فێردەبێت جوانتر خۆی بنوێنێ ...؟**
**کە دەست لەسەوڵ لێدانەکانمان هەڵناگرین ئەوە بۆ کوێ دەڕۆین ...؟**
**هەر لە نێو مەملەکەتە تراویلکە تەڕتەڕەکانی تاریکی دەمێنێنەوە،**
**یان بەنیازین مەرەزە بێ ئارامییەکانی وەرزێکی تر ئاو بدەین ...؟**
**نازانم هەتاو لە رۆژهەڵاتی کام بەهاری تەمەنمان هەڵدێت ...؟**
**کە بێشکەی هەورە سپییە باراناوییەکانی مەست بوون ڕادەژەنین،**
**دەچینەوە نێو هەوارگە بەفریناوییەکانی سپێدە**
**یان هەر لەنێو ڕووبارە هێمنە خەواڵووەکانی مەرگ**
**گۆرانی بۆ عومرە بەسەرچووەکانی خۆمان دەڵێین ...؟**
**کە لە قوڵایی دەریا کەژاوەییەکانی بیر کردنەوەکانم ڕادەمێنم**

نم نم

لەنێو ڕۆشنایی چاوە بێدارییەکانم

گەردانە گەردەلوولیەکانی گەردەنم فڕێ دەدەم

لەژێر کەپری ڕوناکییەکانی تریفە ڕادەکێشم

سەر بەسینەی خەیاڵە سەر مەستە شەرابییەکانی شیعر دەکەم

لەنێو خەونە سپییەکان دا..

بۆ باڵندە و کچۆڵە شەرمنۆکەکانی بەرباران دەگەڕێم /

تاچیرۆکە سێکساوییەکانی خۆمیان بۆ بگێڕمەوەو

باسی ئەم وەرزە ئاگراوییانەشیان بۆ بکەم کە لەگەڵ جوانییەکانی مۆم و

میوەجاتەکانی بەهەشت ڕووت بووینەوە تا بەیانی یاریمان بەپەردەی کچێنی

هەور کرد..!

لەنێو خەونە ڕەشەکانیشدا ...

بەدوای مردنە فەریکەییەکانی خۆمدا دەگەڕێم/

نەوەك

لەشەوە شمشاڵییە شلێرییەکان، ڕەشەبا بەتاریکستانەکانی شەوو

بەگەمە زیکراوییەکانی نێو پەرستگەکان ئاشنایان بکات

لەنێو خەونە سەوزەكانیشدا ..
لەشەوێكی مۆنامۆیی و هارمۆنی دا / لەنێو گەلەرییە ڕووناهییەكانی
ئەڤیندا،
لەگەڵ لاوكێكی لوولدراو/ بەئاونگترین و ئازیزترین ئارەزووە
زەنگیانەییەكانی
زەمەندا
بەنێو كۆلانە پێچاوپێچەكانی پێدەشتی كەڤالە پشكۆییەكان سەفەرم كردو
بەدەم خوێندنەوەی / وەرزە بوركانییەكانی ئاگرو باڕێزە
بریناوییەكانی بەفرو
سولاڤە سەرابیەكانی سەحەر، خۆم بەباوەشە گەرمەكانی دەریا
سپارد
لەنێو خەونە سوورەكانیشدا...
كانییەك كە پڕ لەهاوارەكانی بخووری و باخچەیەك لەئەڤیندارترین
گوڵە بەنەفسەجییەكان،
بوخچەیەك لەزەیتوونیترین وشەم پێشكەش بەغروبە غەمگینییە
ئێوارە هەنارییەكانی
شیعر كرد .

لەنێو خەونە زەردەكانیشدا ...
گەڕامەوە / نێو چاوەكانی باڵندە ئاوییەكان،
لەسادەیی نیگا موچرك ئامێزەكانی مانگ و خۆر و ...
هەموو كەوكەبە كۆچەرییەكانی ژێر/
دەوارەكان و ڕەشماڵەكان و كەپرەكان و چەترە لماوییە لوئلوئیەكانم
ڕوانیییی
لەبێدەنگی پەڵكە زێڕینە زریانەییەكانی زەمەنیشم ڕونییی
مانایەك، پاساوێك، هاوكێشەیەك / بۆ هاتنە لیمۆییەكانی خۆمم
دەست نەكەوت
پرشنگێك، شەبەنگێك، تریفەیەك لەبریسكە ترێیەكانی وەرزە
جۆزەردانییەكانی ئایندەم دەست نەكەوت
لەنێو خەونە ...

شینی و

ئاوی و

خاکی و

پەمەیی و

پرتەقاڵییەکانیشم دا

بووم بەکۆلارەیەکی ڕۆح شەقار بووی پڕ لە برین

برینە ڕەنگاوڕەنگە شەرمناوییە موژگانییەکانی ...

قەیرە کوڕێکی رۆژهەلاتی ... و

شاعیرێکی رۆژ هەلاتی ...و

کچە لەزبیانێکی رۆژ هەلاتی...و

نیگارکێشێك و پەیکەرتاشێك ..و

کەمانجەژەنێکی رۆژهەلاتی ...و

بەئاسمانی /

سەدە خەوتووەکانی منداڵیم و

سەدە بێ ناسنامەکانی سبەینێم دا

نەرم دەفرِم

نەرم  نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم

تا ون دەبم

ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون....!

ئەوە چ پەروانەیەکە پشکۆی نێو بالکۆنەکانی غوربەتیم گەش دەکاتەوەو
هەموو بەیانیانیش دەفتەری خۆزگە هێڤیدارییەکانم پەڕ پەڕ
هەڵدەداتەوە..؟
ئەوە چ تاڤگەیەکە لەنێو دەمارەکانی تەناییم هاژەی دێ...؟
ئەوە چ خەیاڵێکە بەنێو جەنگەڵە وێرانبووەکانی جەنگەکان و بەنێو
دەریایە بێ بنەکانی ئەفسانەکان و بەنێو ئۆقیانووسەکانی جیهانێکی
ترو بەنێو هێمنی مەیخانەکانی  بەهەشتێکی ترو
بەنێو شەقامە گڕگرتووەکانی دۆزەخێکی تر دەمگێڕێ..؟!
ئێمە دەمرین و
لەنێو کۆشکە سپیەکانیش زەماوەند دەگێڕن
چرای رۆشنایی چاوەکانمان دەکوژێنەوە
لەنێو کۆشکە ڕەشەکانیش دا /
بەپەیکەری کەللەی سەرمان دەف لێدەدەن
گەڵای درەختەکانی بەختەوەرترین بەهار وا هەڵدەوەرێ

لەنێو کۆشکە سەوزەکانیش دا /

مرۆڤەکان نامورادانە ناولەپی یەکتری دەخوێننەوەو دەگەڕێنەوە نێو

خەوە خورافییە خەڵووزییەکانیان .

شەپۆڵەکان یەك لەدوای یەك بەڕیز دەمرن

لەنێو کۆشکە سوورەکانیشدا

مرۆڤەکان ڕووت دەبنەوەو لەکانار دەریا ئەفسونییەکان نۆڤلێنە

ڕۆمانسیەکان دەخوێننەوە

باڵندەکان و پەپوولەکان و ماسییەکان وا کۆچ دەکەن

لەنێو کۆشکە زەردەکانیشدا

مرۆڤەکان لانکی منداڵێتی مانگ ڕادەژەنن و لاوژە ژاکاوە

پەژموردەییەکان،

دەڵێنەوە!

لەنێو کۆشکە

شینی و

خاکی و

ئاوی و

پەمەیی و

پڕتەقاڵییەکانیش دا مرۆڤەکان هەروەك پێشوو دەبن بەپەپوولەیەك
لەسەمفۆنیا سۆزاوییە شەرمناوییە ماسۆشییەکانی،
نێو ڕۆحە هەلا هەلا بووەکانی
قەیرە کوڕێك و شاعیرێك و کچە لەزبیانێك و نیگار کێشێك و
پەیکەر تاشێك و کەمانچەژەنێکی رۆژهەڵاتی ...!
بەنێو ڕەهاییترین ئاسمانەکانی خەون
نەرم دەفڕن .....

**نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم**

**نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم**

**نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم**

**نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم**

**نەرم نەرم نەرم**

**نەرم**

**تا ون دەبن ون**

**ون**

**ون ون ون**

**ون ون ون ون ون**

**ون ون ون ون ون ون ون**

**ون ون ون ون ون ون ون ون ون**

**ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون**

**ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون**

ئەوە چ شوعلەیەکی ئۆخژنناميَزە بەسەر گۆنای ژنێکی شەهوەتبازەوە دەبینرێ ... ؟

کە نم نم لەزەتاویترین تاسە بەخەمە ئەسرینیەکانم دەبەخشێ، لە نێو هەر چرکەیەکی تەنیاییم شەپۆلەکانی زیندەگی / ئومێدە ئالۆودییەکانی ئایندەم ڕەنگ دەکەن...

لەنێو هەر چرکەیەکی زیندەگیم شەپۆلەکانی تەنیایی / خەیاڵە خورمایییە خەنەییەکانم ڕەنگ دەکەن، ئیدی گەرد گەرد دادەچۆڕێمە نێو قوڵایی دەریایەکی پڕاو پڕ لەمیهرترین ماهە تابانییەکانی عەشق ئەی ماهی من / ئەی مۆمە مەرجانییە مەریەمیەکەی شەوە یەڵداییەکانی من، چیتر ناتوانم بە وەیشوومەترین و عەدەمیترین و گەردەلوولیترین

وەرزە وەیشوومییە عەدەمییە گەردەلوولیەکان بسپێرم ..

چیتر ناتوانم خۆم بە

لچکە کراسی سەر گەرادنەترین و پەرتەوازەترین و گێژەنیترین ڕابوردووە،

سەر گەردانییە پەرتەوازەییە گێژەنییەکان شۆڕبکەمەوە، ئەی ماهی من،
چیتر گوێ لە چرکەی ئەو کاتژمێرانەی سەرسینگم ڕاناگرم کە نەتوانن
شەوانان / هاواری هەناسەکانم و گریانە گەرمەکانی دڵم بخوێننەوە
کە نەتوانن / نهێنی فەنتازیترین جوانییە سیحرئامێزەکانی ڕەنگەکانم
بۆ ئاشکرا بکەن..!
ئەی ماهە مۆرفینییە برونزییەکانی بەرائەت
لەنێو کۆشکە سپیەکان دا
لەئامێزی خەونێکی سپی
کاتژمێرە سپیەکان / گەمە بەهەستەکان و تاسەکان و نیازەکانی
دڵە پڕاوپڕ لەخەمە خوماریيە خوناویەکانمان دەکەن .
لەنێو کۆشکە ڕەشەکاندا
لەئامێزی خەونێکی ڕەش
کاتژمێرە ڕەشەکان / شووشەی شەرابە،
پڕ لەسەفایە سیرامیکییە سەرخۆشییەکانمان دەشکێنن
لەنێو کۆشکە سەوزەکاندا
لەئامێزی خەونێکی سەوز

کاتژمێرە سەوزەکان / گوێ لە سەمفۆنیایە سەوسەنیە سوریالییەکانی
نێو باخچە ئەوینیەکانی دڵمان ڕاناگرن
لەنێو کۆشکە سوورە کاندا
لەئامێزی خەونێکی سوور
کاتژمێرە سوورەکان / لەبەر غرووربوونی وەزرە مەست مەستە
مەستانەییەکانیان، بەنێو ڕازیانەییە ڕەونەقیەکانی دڵی ئێمە
رانابوون
لەنێو کۆشکە زەردەکاندا
لەئامێزی خەونێکی زەرد
کاتژمێرە زەردەکان / لەنێو کەژاوەی مەرگە شێنەییەکانمان
لەئاوێنە ئاوییەکانی ئایندەمان ڕانامێنن .
لەنێو کۆشکەکانی ترو لەئامێزی خەونەکانی ترو کاتژمێرە
ڕەنگاڵەییەکانی تریش
تابلۆیەکن لەغەریزەی چەپێنراو و کێلگەیەکن لەپشکۆی سەربڕاو و
خەرمانێکن لەیادگارییە بەجێماوەکانی

**نێو جەستە شەقار شەقار بووە پڕ لەتاسەو برینە ئاگرینەکانی /**

**قەیرە کوڕێك و شاعیرێك و کچە لەزبیانێك و نیگار کێشێك و**

**پەیکەر تاشێك و**

**کەمانجەژەنێکی ڕۆژهەڵاتی**

**بۆ کۆلارە غەریبە غوربەتیەکان دەڕوانن کە بەنێو**

**ئاسمانی /**

**دڵە سپی سپییەکانی عەشق و**

**چاوە ڕەش ڕەشەکانی شەوو**

**پێدەشتە سەوز سەوزەکانی سروشت و**

**خەیاڵە سوور سوورەکانی سپێدە ...و**

**زەردەپەڕە زەرد زەردەکانی زەمەن،**

**نەرم دەفڕن**

**نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم**

**تاون دەبن**

**ون ون ون ون  ون ون ون ون ون ون ون ون  ون ون ون ون ون ون ون ون...!**

# ئاوێنەکانی چارەنووس

(1)

**ژنێك لەنێو کێڵگەکانی با**
**خۆی لەگەردەلوولی خەونەکانم ئاڵاندووە**
**یاری بەزەنگینە ڕەنگاو ڕەنگەکانی تەمەنم دەکات**
**مۆمی نێوچاوەکانی مانگ دادەگیرسێنێ**
**لەودیو وەرزەکانی ڕوناکی خۆی رووت دەکاتەوە**
**لەگەڵ گەڵاکانی ئاو و**
**بورژانگەکانی گیا سەمام بۆ دەکات و**
**نەرم نەرمیش بەئاوێنە شکاوەکانی چارەنووسم**
**پێ دەکەنی..!**

(2)

منی مەستتر لە باران و

فێنکتر لە بەیانی

شل شل و  تاو تاو

کێلگەکانی با و ڕوناکیەکانی مانگم بەجێ هێشت

خەونە خرپنەکانی خۆمم گرتە باوەش

توند توند ... توند توند توند

هێندەم گوشین

تا زیندەگیم بەخشی بەجوانیەکانی تریفە

شل شل و تاو تاو

بۆ نێو قوڵاییە تاریکیەکانی شەو

چوومە خوارەوە

شارێك پڕاو پڕ لە گومبەزەکانی گوناه و

دۆڵێك پڕاو پڕ لەئەشقیای سەرمەدی

سروود و سوورەتە سێوییەکانیان دەخوێند

تا دەهات/

هەنگاوەکانم بەگورترو گەرمتر دەبوون

تا دەهات /

مەشخەڵە بلێساویەکەی نێو چاوەکانم

ئەشکەوتەکانی ئاسمان و

ئاسمانەکانی نێو دەریای رۆشنتر دەکردەوە

تادەهات /

بارێزە سەوداسەرییەکانی خەیاڵم

سەرفرازو شەهوەتبازو ڕەنگاڵەتر

سەرمەستترو سەفاترو سۆزانیتر

شۆخترو شەنگترو شەنگەبیتر

روونتر و ڕەنگینتر و رەهاتر دەبوون...!

منیش / بێپەرواو بێپەرواو بێپەروا

سەرفرازو سەرمەست و سەفاو سۆزانی

شەهوەتبازو شۆخ و شەنگ و شەنگەبی

ڕەنگاڵەو ڕوون و ڕەنگین و ڕەها

خۆم دایە دەست

کانیاوە بەفریناوییەکانی جوانی ...!

جوان جوان بازمدایه نێو
ئاوێنه سەرابیەکانی ئەڤینی
لەوێندەرێ /
لەئایندەی خۆمم ڕووانی
لەتیشکه دوورەکانی کازێوەو
لەمەرجانه کریستالیەکانی عەشق و
لەوەرزه ئارامیه میهرەبانیه ڕابردووەکانی تەمەن
شل شل و تاو تاو
لەنهێنیه پەریشانیەکانی غوربەت و
لەجەسته مۆماوییەکانی خۆرەتاو و
لەکەپره ڕەنگاو رەنگەکانی ئاینده و
له پەپووله باڵشکاوەکانی،
نێو مەراقەکانی خۆمم ڕوانی ...!
سروودەکان و سوورەتەکان و خەونەکان هاوکێشەکان و
پرسیارەکان و گومانەکان و نهێنیەکان و رازەکان و ئومێدەکان و
شیعرەکانم شیکردەوە
جەستەی خۆم و ئاوێنه شکاوەکان و گەڵاوەریوەکانم
کۆکردەوە....شل شل/

مرواریه ڕەنگ هەنارییەکانی سەرسینگی شاژنە شلێرییەکانی
نیو عیشوەو نازی پەلکەزێرینەشم / کۆکردەوە ....!
سەرگەردان و بێ پەروا
یاخی و یاخی و یاخی
یاخی / لەخەونە جوانە مەرگبووەکانی
دەشتەکاکی بەکاکیەکانی غوربەت
یاخی/ لەچلە نێرگزە چاوگەشەکانی
نێو خۆزگەو هەناسەکانی سەرسینگی دایکم
یاخی/ لەکچۆلە شەرمنۆکەکانی کۆلأنە قوڕاوییەکانی منداڵیم
یاخی لە هاوارەکانی نێو سەدە بازنەییەکانی زەمەن ...!
یاخی و یاخی و یاخی
هەر بەو حەسرەتە کوشندە دڵتەڕانەوە
شل شل و تاو تاو
بەئاوێنە شکاوەکانی چارەنووسی خۆم تێر پێکەنیم

ئایاری 2005

# خەونەکانی مردن

من گەشتێکم کرد

پڕاو پڕ بوو لەسنەوبەرە سەربڕاوەکانی دۆزەخ

پڕاو پڕ بوو لەهەورە تریشقەکانی مەرگ

لەخەونە بازنەییەکانی ڕوناکی

پرسیارێکیشم پێ نەبوو بۆ گەڕانەوە...!

نەم دەزانی نیگاکانم لەمەنزلگەی

چ شەپۆلێك چ باڵندەیەك هێور دەبنەوە ...؟

بەپانتایی شەقامەکان لەنێو خەیاڵە وونبوە بەرائەتیەکانی

گوناه دەسوورامەوە

خۆم و توورەگەیەك لە ڕەنگە جوانەکانی شیعرو

بوتلێك شەڕاب و هیچی تر

**من بوخچەیەکی نەکراوە بووم /**

**پڕاو پڕ بووم لەنهێنی ماسولکە سپیەکانی بەفر**

**پڕاوپڕ بووم لە ئەگریجە نەسیمیەکانی خۆرەتاو**

**بەئاوازە گێلاسەییەکانی سروشت**

**بێشکەی مێژووم ڕادەهەژاند**

**من لەگەڵ شەوە جوانەمەرگبووەکانی بەهار ڕۆیشتم**

**بەو خەیاڵەی تا ئەبەد جارێکی تر وێنەی بتە شکاوەکانی "با"**

**نەکێشکمەوەو**

**چیتر روخسارە فرمێسکاوییەکانی شکستەکانم نەبینمەوە**

**رۆیشتم/**

**خۆم لەنێو دارەبازە ئەستێرەییەکانی قەدەر بینیەوە**

**تاو تاو لەڕۆشنایی گەڵا هەڵوەریوەکانم دەڕوانی**

**بۆ نێو قوڵایی زیکرە هێمنە شەوانەییەکانی ئاو شۆردەبوومەوە**

**جارجار گوێم لەسەمفۆنیایەك دەبوو، هەستم دەکرد**

**هەموو دەمارەکانی جەستەم خاو دەکاتەوە و پێلووی چاوەکانیشم**

**بە سەما دەهێنێ**

دەستەکانم دەبنە دووباڵی ئاوریشمی بۆ فڕین و

هەنگاوەکانیشم لەگەڵ چرکە گەرمەکانی شەو

ئاوێتەی نێوناخی یەکتری دەبوون

هەندێ جاریش لەبنار کێوە سەختە سەختەکانی ئەڤین

بەدیار سفرە ڕەنگاو ڕەنگەکانی "با" گۆرانیمان دەگوت

لەنێو مەمکۆڵەکانی زەمەن لەسەر خۆشبوونی هەورمان دەڕوانی

ئیدی لەو ساتە ڤینۆسیانەدا،

من پەرتبوونەکانی خۆمم بیرچووبووەوە و

نەم دەزانی من ئەو مرۆڤە هەلا هەلایە دڵ شەقار بووەم

کە هەر پەنجەیەکم لەکیشوەرێك و

هەر پەراسووەکم لەئۆقیانووسێك و

هەر گۆشەیەکی دڵم لە مەملەکەتێك بەجێماوە

بەتەنیشت دارستانێکی خەوتوودا تێپەڕیم

گوێم لەناڵە ناڵی کێڵگە خەملیوەکانیش دەبوو/

بەدەم وەنەوزی مەرگەوە، ئایەتی گزنگە سەحەریەکانی

بوومەلەرزەیان دەخوێند

رۆیشتم /

خۆم و خەیاڵە برووسکەییە مەشخەڵاوییەکانی گەنجێتیم و

چەند یادگارییەکی یاداشتکراو بەپێنووسەکانی ئاو و هیچی تر

هەموو /

پێدەشتەکان و بیابانەکان و ئۆقیانووسەکان و کیشوەرەکانم بری

بۆ دواجار /

بۆ ماسیەکان و پیرە دار هەنجیرەکانی نێو گەرەکە هەژارنشینەکانی ئاگرو

بۆ ئەو کچۆڵانەی،

لەئاهەنگی ماڵئاواییم مۆمیان بۆ دەگیرساند بووم ، نووشتامەوە...!

بۆ ئەو شەقامانەی،

دووگمەکانی سوخمە پەمەییەکەی خۆیانیان بۆمان دەترازاند

بۆ سەدە بریندارەکانی نێو ماڵە تاریکەکەم

بۆ هەیکەلی،

ئەو فەیلەسوفانەی بەبەرچاوی خۆمەوە سووتێندران، نووشتامەوە...!

بۆ دواجار ئاورێکم بۆ دواوە دایەوە بینیم

لەشکری/ مردووەکان و ژنە مەمك براوەکان و پیاوە کوێرەکان و

منداڵە "دڵ شووشەکان" ⋆

هەر هەموویان بەدوامەوە بوون

نەمتوانی چیتر رێ بکەم /

بەهەمان ڕێگەی خۆم دا گەڕامەوە ..

هەموو مەمکە فرێدراوەکان و چاوە هەڵکۆڵدراوەکانم دۆزییەوە

مەمکەکان/ هەروەك جاران گەرم بوون

شێوەی چەنجەکانم و پەرەی گوڵی لێوەکانمیان بەسەرەوە مابوو

ئای کە جوان بوون/ لەبالاْ خوداوەندییەکەی (ئەفرۆدیت)⋆⋆

جوانتر بوون .

چاوەکانیش بەنیگایەکی نەرمەوە لێیان دەڕوانیم

وام هەست دەکرد گلەییم لێ دەکەن و دەڵێن

کەی وادەی مردنی ئێمە بوو کەی ...؟؟؟

رۆشنایی دڵە شووشەکانیش لەژێر پنجەگیایەکان

خۆیان حەشار دابوو.

**گەڕامەوە و دووبارە ,**

**کێلگەکان و دارسنەوبەرەکان و هەموو دەریاکان و کێشوەرەکانم**

**بینیوە..!**

**دووبارە،**

**هەموو مۆزەخانەکان و گۆڕستانەکان و گومبەزەکانم بینیەوە**

**ئەو رەشماڵانەی کە لەقژی کچۆلەکان دروست کرابوون**

**گەڕامەوە نێو ماڵە تاریکەکەم**

**لەشکری/ مردووەکان و ژنە مەمك براوەکان و پیاوە کوێرەکان و**

**منداڵە دڵ شووشەکان / هەر هەموویان بە دوامەوە بوون**

**هەموو دەرگای ژوورەکانم بۆ کردنەوە**

**ژوورێك پڕاوپڕ بوو لەئەلبومەکانی منی منداڵ**

**ژوورێك پڕاوپڕ بوو لەئەلبومەکانی منی لاو**

**ژوورێك پڕاوپڕ بوو لەئەلبومەکانی منی عاشق**

**ژوورێك پڕاوپڕ بوو لەئەلبومەکانی منی باوك**

**ژوورێك پڕاوپڕ بوو لەئەلبومەکانی منی مردوو**

**بە / گۆشە بەگۆشەی یادگاریەکانم دا هاتمەوە**

سالْ بەسالْ و مانگ بەمانگ و رۆژ بەرۆژ گەڕامەوە دوا

تاوێك لەساتە خۆش و ناخۆشەكانم ڕوانیەوە

لەمردن و لەدایكبوونەكان و جەنگەكان و جێ ژوانگە پڕ ترسەكانی

شەوانم ڕوانیەوە

لەشكری/ مردووەكان و ژنە مەمك بڕاوەكان و پیاوە كوێرەكان و

منداڵە دڵ شووشەكان هەر بەدوامەوە بوون

ژوور بە ژوور ، گۆشە بەگۆشە

سالْ بەسالْ

چركە بەچركەی تەمەنی خۆمم بەسەركردەوە

دواجار،

لەو ژوورە گیرساینەوە كە پڕبوو لەئەلبومەكانی منی مردوو

لەدەروازەی چاوەكانی منی مردوو چووینە ژوورەوە

شەقامەكان ڕووناك ڕووناك

شەوەكان پڕ تریفەو دیمەنەكان دڵڕفین و

بەیانیەكان پڕ لەخەندەو

دنیایەكی جوان بوو نێو چاوەكانی من ...!

چوومە نێو ساتە لاشعوریەکانی ئەو سای خۆم

بەرائەت و

پێکەنین و گریانەکانی خۆمم بە رووتی بینیەوە ...!

نامە دڵدارییە سادەو خنجیلانەکانیشم بینیەوە

کە لەنێو دەمارەکانی عاتیفەم هەڵگیرابوون

بەرەو گۆشە سپیەکانی دڵم ئۆغرمان کرد

دنیایەکی ئیجگار گەورە بوو دڵی من

رۆژهەڵات بەگەورەیی خۆی لەوێندەرێ لێی راکشابوو

لاپەرەکانی خەونەکانم هەڵدایەوە

لەنێو منداڵدانی خۆزگەکانم / مەراقە گەورەکان و

ئومێدە تازە پشکووتووە خنکێندراوەکانی  خۆمم بینیەوە .

وێنەی ئەو کچانەی خۆشم و یستبوون،

بێوەژنەکان و کوڕ و کچە لەشفرۆشەکان و

شێتە ناسراوەکانی شار و هەر هەموویانم بینیەوە

هەزاران هەزار بوخچەی نەکراوەی ڕەنگاوڕەنگ

یەکێك پڕاوپڕ لەشیعری نەنووسراو

یەکێك پڕاوپڕ لەخەون و مەراق و ئومێد

یەکێك پڕاوپڕ لەخۆزگەی منداڵانە

یەکێك پڕاوپڕ لەبرینی ئەڤینی

یەکێك پڕاوپڕ لەحەزەکانی سێکسی

یەکێك پڕاوپڕ لەخەمەکانی تەنیایی

یەکێك پڕاو پڕ لەنامۆیی و غوبەرت

ئاخ ئەلبومەکانی منی مردوو

چۆن من و لەشکری مردووەکان و ژنە مەمك براوەکان و

پیاوە کوێرەکان و منداڵە دڵ شووشەکان و ....

هەر هەموومانی هێنایە گریان ...!

ئێستا لەوەتیێ دەگەین/

بۆچی مردنەکانی ئێمە بێ دەنگی بەرووبارەکان و

ڕەشی بەشەوەکان پۆشیبوو ...!

ئای کە تاوانبار بووین/

نەمانتوانی، لە نێو بەلەمەکانی باران ئۆقرە بگرین

ئێستا /

لەزیکرە بەردەوامەکانی ئاو و

لەسروودەکانی رەشەبا ...و

لەشنەبایە خامۆشەکانی ڕوناکی و

لەخەونە رەنگاو رەنگەکانی مردن / تێ دەگەین

ئێستا لەنهێنی /
بریسکانەوەی قژە زەردە زێڕینیەکانی پایزو
لەگۆرانیە پڕ نەغماوییەکانی بەیانیان و
سەمای هەڵمە گڕگرتووەکانی هاوین و
لەهەڵوەرینی بورژانگە نەرمەکانی گوڵ / تێ دەگەین
بۆیە بڕیارماندا هەر لەوێندەری،
لەنێو ئەلبوومەکانی منی مردوو بمێنینەوە
دیسانەوە شۆرش بکەین
تا ئەو کاتەی/ باڵندەکانی ئارەزوومان
بەرەهایی ی ی ی
لەئاسمانە شینەکانی خەون و
خەونە خۆشەکانی خەیاڵ و
خەیاڵە گەرمەکانی خۆشەویستی
لەشەقەی باڵەکانیان نەدەن/ نەگەرێینەوە ...!

ئۆکتۆبەری 2003

* لە رۆمانی ( دواهەمین هەناری دنیا ) ی " بەختیار عەلی وەرگیراوە
** لە ئەفسانەکانی یۆنانی کۆن / ئەفرۆدیت خودای بەزم و لەزەت و سێکس بووە .

# فیردەوسی شەوە یەڵداییەکانی لم

( بەیادی 182 هەزار پەپوولەی سپی )

لە نێو بازنەکانی سێبەر
دەسووڕاینەوە
ئەسمەریانە لەئەزموونەکان و لەئایندە و
لە مردنەکانمان دەڕوانی
لەو ئێوارەیەش لەدایك بووین
کە درەنگ وەخت بوو
بۆ چوونە جێژوانگەی خۆرەتاو
بۆیە نامورادانە
خۆمان لەنێو زەمەنە تاریکەکانی
مەملەکەتی لم بینیەوە ...!

ئەسمەریانە
لەخەونە شەوینیەکان و
شەباهەنگی ئاسمانە فیردەوسیەکانمان
دەروانی
بیّ ئاگا لەبزە گەرمەکانی گیا
بیّ ئاگا لەگۆرانیە ئومێد بەخشەکانی باخچە
خۆمان لەنیو قەدەری ڕەنگەکان و
لەنێو سێبەری شکستەکان/ بینیەوە
لەو ڕۆژەوە،
سەدەکان لەنێو هاوارەکانی ئێمە ڕاکشاون
مێژووش لەنێو برینەکانمان
لەو ڕۆژەوە
هەر دەفڕین و کێلگەیەکمان نیە بۆ نیشتنەوە
دەجەنگێن و دەرگایەکمان نیە/ بۆ دەرچوون
پەنجەرەیەکمان نیە بۆ ڕوانین
نازانین

**خۆر لەکاملاوە هەڵدێ و**

**پەپوولە سپیەکانی عەشقیش**

**لەکام گوڵزار دەنیشنەوە..؟!**

**کاتێك بەکۆمەڵ دەنێژراین**

**وامان دەزانی**

**مەرگ هەر لە ئەزەلەوە/ بۆ ئێمە لەدایك بووە !**

**کاتێك هەموو ئێوارانێك و شەوانێك**

**وەکو گەڵا بەسەر سینگی بیابانەکان / هەڵدەوەراین**

**وامان دەزانی**

**خەزان هەر لە ئەزەلەوە**

**لەنێو هەناسە سیبریاییەکانی ئێمە لەدایك بووە !**

**ئەی فریاد ڕەسەکەم / دەپێم بڵێ**

**ئێمە لەسەر کام ئەستێرە**

**هاتووینەتە بووین...؟**

**لەنێو کام دەریاش بەمردنە ئاوییەکانت بەخشین...؟**

**دەپێم بڵێ**

**ئێمە بەرەنگی کام یەکێك لەرەنگە جوانەکانی**

**پەلکەزێرینە دەناسرێینەوە**

**کەهاتین**

**ئێمە سەمفۆنیایەکی وەهمی بووین**

**لەنێو کۆڵانە سەهەندیەکانی باران / دەبیستراین**

**کەهاتین**

**ئێمە مانگێك بووین لەبەفر**

**لەئاسمانە سەرابیەکانی روناکی / هەڵهاتین**

**بێئاگا لەلاوژە بێدارییەکانی ئاو**

**لەگریانە باڵندەییەکانی سنەوبەرەکان**

**ئێمە هاتووین**

**تا ئەبەدیەت بەلم و**

**سەرووەیش بەرەشەبا ببەخشین و**

**خۆشمان بمرین**

ئێمە هاتووین
تارۆشنایی بەشەو ببەخشین و
خۆشمان دارستانێك بین لەشەوەزەنگ
سۆمای چاوەکانمان
بەشەپۆڵەکان بەخشین و
خۆشمان رەوە ئاسکۆڵەیەکی بێ بینا...!
ئێمە هاتووین تا تەمەنی گەنجێتیمان
هەگبەی پڕ لە خەونە ئاڵەکانمان
ببەخشین...
بە / ئەفسانە قەدەریەکانی گەردەلوول و
بە / گەردەلوولە ئەفسانەییەکانی قەدەر و
بە / قەدەرە گەردەلوولە ئەفسانەییەکان...!
ئێمە لەبەیانیەکی سۆزانی
لەبنار مەمکۆڵە ووشکهەڵاتووەکانی
سەدە خوێناوییەکان
لەئامێزی بەهارێکی وون و
لەنێو هەناسەی
شەونمە هێمنەکانی غوربەت / لەدایك بووین

بێئاگا لەلاوکە بەسۆزەکانی بەفر

بێئاگا لەتەنیاییە هەمیشەییەکانی تاراوگە

بەرەو قوڵاییە بێ بنەکانی لم چووینە خوارەوە

چ دنیایەکی تاریك و بێ دەنگ بوو

ئەم فیردەوس و ماڵە ئەبەدیە تاریکە ماوییەمان...!!!

ئێمە لەوێندەرێین

لەقووڵترین ئۆقیانووس و

لەدوورترین کیشوەرە تەماوییەکانی دنیا

هەموو شەوێ

لەجەنگێکی بێئامان داین

لەگەڵ تاریکییە کریستالیەکانی جەستەو

وەرزە رەشەکانی دوای مردنی کات و

گەمە ئاتەشیەکانی نێو (کۆچێکی هەتا هەتایی)

هەموو شەوێ
لەگەڕانێکی بێ ووچان داین
بۆ دۆزینەوەی مروارییە گیاییەکانی
گەردنی گەڵا و
حەرفەکانی جوانی نێو قەسیدە بخورییەکان و
هێلە بازنەییەکانی نێو چاوەکانی ئەستێرە
ئێمە لەوێندەرێ
گەریدەترین لە با
بۆ گەیشتن،
بە پەرستگە ئاگراوییە زەردەشتیەکانی خەیاڵ
لەوێندەرێ،
رۆندکەکان رووبارێکی پەمەیین و
خەونەکانیش پێکهاتەیەکن / لەئاگرو شەراب
خۆزگەکان پرشنگێکن / لەمەرجەکانی ئەڤین
لەوێندەرێ،
دڵە دلۆڤانیەکان
لەحەسرەت لاوکە فیراقیەکانی مانگ
خەریکە گڕ لە نەشئەی سەماکانیان هەڵدەستێ

**لەوێندرێ خەیاڵەکان**

**هەموو شەوێ باڵ دەگرن و دەفڕن**

**دوور دوور دەفڕن**

**هەندێ جار هەر ناگەڕێنەوە**

**پەنجەرەکان هەمیشە کراوەن**

**چاوەکانیش ئەوەندە لەچاوەروانی دان...!**

**شەوەکان ئەوەندە درێژن هەر نابڕێنەوە**

**گۆرانیەکانیش هەموودەم دووبارە دەبنەوە**

**ئای کە بێ ئۆقرەیە ساتەکانی چاوەڕوانی**

**لەم فیردەوسە تاریکەدا...!!!**

# پیتە جوانەمەرگبووەکان

ك

کورەیەك لەنێو خەونەکانم

هەموو شەوێ

سەری پەنجەکانم و قەلەمەکەم و

دەمارەکانی بیرکردنەوەم ، دەسووتێنێ

کەوێك لەبناری شاخەکانی دڵم

بۆم دەخوێنێ،

من لەوەتەی هەم،

هەموو شەوێ لەنێو خەونەکانم

جوانەمەرگ دەبم

مەرگێکی ئارام، مەرگێکی شێنەیی

لەگەڵ وەرزەکانی تەمەنم

گەورە دەبێ...!

و

وێنەیەك لەوێنەكانی خوا

لەنێو پیتە جوانەمەرگبووەكانی یادگاریم

دۆزییەوە .

ئاخێكم هەڵكێشاو ووتم

دەبێ رۆژێك دابێ و منیش

وێنەی ماڵەكانی خۆم

لەپەنا ئەستێرەیەك

یان لەباوەشی شەپۆڵەكان

بدۆزمەوە...؟!!

ر

رووبارێك

بەهێمنی لەگەڵ خۆیدا دەمبا

دەمبا دەمبا دەمبا

دەمبا دەمبا دەمبا

دەمبا دەمبا دەمبا

منیش هەر لێی رادەمێنم

تا بە پەرستگەکانی عەشق و

گۆڕستانی پیتە جوانەمەرگبووەکانی

نێو شەوە شیعراوییەکانی خەیاڵم

دەسپێرێ...!

د

دەنگ دەنگ دەنگ

ڕەنگ ڕەنگ ڕەنگ

نەدەنگ هەیە، نە رەنگ

هەر دەڵێی مرۆڤەکان

لەگەڵ پیتەکاندا مردوون

هەر دەڵێی باڵندەکان

لەباوەشی

ئەستێران و بروسکەدا خەوتوون،

ئەم دنیایە چەند کشومات و بێدەنگە

دەریاکان و تاڤگەکان و رەشەباکان

چەند بێدەنگن بێدەنگ....!

هەر دەڵێی لەنێو چاوەکانی

پیتە جوانەمەرگبووەکاندا خەوتوون...!

س

سێوێکی حەرام

حەرام حەرام حەرام

حەرامترین سێوی مەملەکەتی غوربەتم خوارد

تائێستا،

سێ هەزار و سێ سەدو سی و سێ سێوی

حەرامم خواردووە .

بەڵام من بەپێچەوانەی ئادەم

تا سێوە حەرامەکان بخۆم

زێتر بەقووڵایی ئەم غوربەتخانەیە

دەچمە خوارەوە...!

ت

تاوسێك

رەنگینترین لەمیوەجاتەكانی بەهەشت

نەخشینتر لە ڕوخسارە ئێستێتیكیەكەی ئاگر

لەنێو وەرزەكانی تەمەنم

باڵەكانی خۆی دەكاتەوە و لەگەڵ خۆیدا

بەنێو سێبەرە شینەكانی خەیاڵ

دەمفڕێنیّ...!

أ

ئاوی نێو لەشی ژنێكی هەورین

وەكو باران بەسەر

كێڵگەو دارستان و باخ و بێستانەكانی

رۆحم دا دبارێ

دوای توانەوە منیش دەرژێمەوە نێو دەریاكان

لەوێندەرێش جارێكی تر دەتوێمەوە

هەر/

دەتوێمەوە دەتوێمەوە دەتوێمەوە

تا وون دەبم...!

ن
نامەیەكم بەدەست گەیشت
هیچ ناونیشانی لەسەر نەبوو
لەنێو نامەكەدا
پیتەكان بەجوانەمەرگبوویی خەوتبوون
وشەكان بۆنی فرمێسكی گوڵیان لێ دەهات
پیتەكان بەرلە مردنیان
ئەم مەسیجەیان بۆم ناردبوو

( ئێرە وێستگەیەكە بۆ مردن
ئێرە وێستگەیەكە بۆ عەشق
ئێرە وێستگەیەكە بۆ ژیان
لێرەدا، بەئارامی
جووت ببن عەشق بكەن سەما بكەن
ئێرە ماڵمانە ماڵ...!)

ئەیلوولی 2005

# گومان

ڕەنگە هەموو شتەکان ڕاست بن...!

ڕەنگە گەر سروشت نهێنی ڕەنگەکانی بدرکاندبا

جوانتر خۆی بنواند با

گوڵەکان/ سیحراویتر خۆیان خزاندبایە نێو دیدەمان و

دەریاکانیش موسافیرەکانیان بەمەرگ نەسپاردبایە

ڕەنگە هیچێکیش لەم ڕوانینانەی من ڕاست نەبن...!

رەنگە گەر من لەدایك نەبام

رەوەندی هەموو شکستەکان بەئاراستەیەکی تر گوزەریان کردبا و

ووشەی حەقیقەت و گوناه نەهاتبانە بوون...!

پێکهاتەکانی
جەنگ و مەرگ
یاخی بوون و عەشق، مانایەکی تریان هەبا...!
رەنگە من تەوەزەلیترین نووسەر بم
کەنەمتوانیبێ تێنوێتی خوێنەرەکانی خۆمم شکاندبێ
ڕەنگە من هەموو شیعرەکانی خۆمم
تەنها بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکساوییەکانی خۆم نووسیبێ
لەگەڵ ئەوەش دا ڕەنگە
ئەزەلیەتی / شۆرش و مانەوە بۆماوەییەکانی میهر
لەدەرەوەی بازنەی بیرکردنەوەکانی من
شتێکی زۆر تورەهات و هیچ و پووچ بن ...!
بۆیە من هەمیشە بەگومانم
لەبوونی خۆم
لەشیعرەکانم
لە بینینەکانم
لە خەونەکانم
لە ئایندەم
لەو مرۆڤەی خۆشم دەوێ

لەبیرۆکە ئەفسانەییەکانی ،
لەخاچدانی مەسیح و ئایەتە زەردەکانی خورافیات
لەشەپۆلە بێ ئارامیەکانی زەمەن
لەهەمووووووووووووووووشت ...!
من پارچەیەکم لەگومان
گومانیش کەرنەڤالێکە لەمن
پێکەوە
بەنێو شەقامەکانی تەنهایی و غوربەت دا
پیاسە دەکەین و
پێکەوە شەوانان دەخزێینە نێو جێگا و
پێکەوە هەناسە دەدەین و
هەر پێکەوەش گەورە دەبین ...!

دیسەمبەری 2003

# مەرگی من و تەنیایی ژنێکی

(1)

لەنێو قوڵایی تەنیاییم دا
شەوانان / پڕاوپڕ دەبم لەنیگەرانیەکانی ئاگرو
لەخەونە ڕەنگاو ڕەنگەکانی ئاو
لەنێو قوڵایی بێ دەنگیم دا
بەیانیان / گۆزەکانی تەمەنم پڕ دەبن لەڕووناکی و
وەرزەکانی نێو بیرکردنەوەکانیشم پڕ دەبن
لەپرسیاری عەبەسی
من ئێستا، سەرمەسترم لەڕەنگەکانی سروشت و
وونترم لەگەڵ وەریوەکانی نێو چاوەکانی — با —
بەنێو کۆڵانەکانی تەنیایی
تەنیا تەنیا / لەژێر باران دا سەما دەکەم و
وجوودیانەش بەرەو ئاسمانی باڵندە سپیەکان دەفرم

من ئێستا، ڕووناکترم لە مانگە شەوەکانی
نێو خەیاڵەکانی مردن
سپیترم لە مەمکۆڵە بەرسیلەییەکانی شەو
بێ دەنگ بێ دەنگ / جلەکانم دەدەمە دەم — با — و
بەرەو دۆزەخی نێو جاویدانیەتی مانگ دەڕۆم

-2-

ئەی ژنە جوانەکەی
نێو نیگەرانیەکانی ئاگر ،
خۆتۆش لەنێو قولاّیی تەنیاییدا بۆ مانگ دەڕوانی
دەتۆش سیقانەکات بدە دەم با
باڕووت ببیەوە وەکو من
لەم مانگە شەوی تەمەنمان
هەرچ نەبێت بابزەیەك بێتە سەرگۆنامان و
شەوێك لەئامێزی یادەکانی بمێنمەوە

-3-

دەسکە گوڵێك

لەنێو گوڵدانێکی ڕەنگ ئاگراوی

لەسەر مێزی ماڵی ژنێکی تەنیا دانراوە

گوڵەکان ،

چاوەکانیان پڕاوپڕە لەنیگەرانی

لەدەرەوەی ماڵەکەش

باڵندەیەکی سەوداسەرو سەرمەست و سپی

دەسووڕێتەوە

چاوەڕێ یە/ پەنجەرەیەك بکرێتەوەو بێتە ژوورەوە

هەرچ نەبێت، تاوێك گوڵەکان بۆن بکات و

ئینجا ، پەڕەی باڵەکانی و لەش و لاری بداتە دەم باو

ڕووت ڕووت بەرەو ئەستێرە سپیەکان

بفڕێتەوە ...!

-4-

دوێنێ شەو تابەیانی

لەئامێزی ڕوناکی ژوورەکەم دا خەوتم

دەرەوەش تاریك تاریك

بەر لەخەوتن / تاچاو برِکات

لەشەقامەکانی ڕووناکیم ڕووانی

جگە لە مەرگی خۆم و تەنایی ژنێك

چیترم نەبینی

دواتر لەمەملەکەتی تاریکیشیم ڕووانی

ئەستێرەی ڕەنگاو ڕەنگ و

باخ و بێستانی سەوزو

حۆری باڵا شووشەیی و

گەردەلوولەکانی لم و

رووتبوونەوەی سەحەرو

هەموو شتێکم بینی هەموو شتێك

کەڤالێکی جوان و بەهەشتێکی

ڕووناك ڕووناك بوو تاریکی ...!

**باران دەبارێ و**

**گوڵە سپیەکانی هەناسەم سپیتر دەبن**

**باران دەبارێ و**

**سێبەری دار سنەوبەرەکان دەچەمێنەوە بۆ با**

**باران دەبارێ و**

**تریفەی مانگ عەشق لەگەڵ شەپۆڵەکانی**

**ئاودا دەکات .**

**باران دەبارێ و**

**سەدەکان بەدەم سەماوە حیکایەتی**

**مەرگی من دەگێڕنەوە**

**باران دەبارێ و**

**دەریا مۆنامۆی نێو خەیاڵەکانی ژنێکی تەنیا دەژەنێ**

**باران دەبارێ و**

**بەفر نیگەرانیەکانی ئاگر بۆ سەوزایی باس دەکا**

**باران دەبارێ و**

**تاریکی دێتە نێو ژوورەکەم و کتێبەکانم**

**لەنێو مەمکۆڵەکانی خۆی دا هەڵدەگرێ و**

**دەڕواتەوە**

**گوڵە سپیەکانی هەناسەم هەڵدەوەرن**

**باران هەر دەبارێ**

**سێبەری دارسنەوبەرەکان پیر دەبن**

**باران هەر دەبارێ**

**تریفەی مانگ و شەپۆڵەکانی ئاو**

**پەردەی کچێنی و ستیانەکانیان دەدەنە دەم با**

**باران هەر دەبارێ**

**سەدەکان بەدەم سەماوە حیکایەتی مەرگی خۆیان**

**بۆ تەنیاییم دەگێڕنەوەو**

**باران هەر دەبارێ**

**دەریا مۆنامۆی خەیاڵەکانی خۆی**

**بۆ ژنێکی تەنیا دەژەنێ و**

**باران هەر دەبارێ**

**ئاگر نیگەرانیەکانی خۆی بۆ سەوزایی و بەفر باس دەکا**

**باران هەر دەبارێ**

**خۆم و  کتێبەکانم لەنێو مەمکۆڵەکانی تاریکی**

**ڕەشماڵێك هەڵدەدەین**

**بارانیش هەر دەبارێ و هەر دەبارێ و هەر دەبارێ**

باران هەر دەبارێ و
منیش لەنێو هەناسەکانی شەوەزەنگ
بۆ مەمکۆڵەکانی شیعر و
گوڵە فیردەوسیەکانی عەشق و
شەونمە ڕووتەکانی ڕووناکی دەڕوانم

باران هەر دەبارێ و
منیش لە ئامێزی خەیاڵە سپیەکان
بۆ ئەو ئەستێرانە دەڕوانم
کەپڕاوپڕن لەباڵندەی تەنیا

باران هەر دەبارێ و
منیش لە مردنە شێنەییەکانم
بۆ ئەو ئۆقیانووسانە دەڕوانم
کە ژنە ئاوییەکان
چیرۆکی تەنیایی خۆیان بۆ ماسیەکان
دەگێڕنەوە

باران هەر دەبارێ و

منیش تا چاو بڕکات هەر دەڕوانم

تامەرگی خۆم و سەمای ژنێکی تەنیاو

زەردەخەنەی ئاگرو فڕینی باڵندەسپیەکان

لەنێو ئاسمانێکی ترو

لەسەر ئەستێرەیەکی تر دەبینم

تا چاوبڕبکات هەر دەڕوانم

بۆ شەوە زەنگە مەست مەستەکان تاریکی و

بۆ گزنگە پڕشنگ پڕشنگەکانی ڕووناکی و

بۆ ئەستێرە دوور دوورەکانی خەون...!

سەرەتای 2006

# ئاوێتە بوون

**من لە نێو باخچەکانی بارانەوە**
**بۆ یەکەم جار**
**چاووم بە جوانیە سیحراوییە سوریالییەکانی**
**بالآی تۆ کەوت .**
**من لە نێو جوانییە بورکانییە زایەندییەکانی**
**بالآ سنەوبەرییەکەی تۆوە**
**بۆ یەکەم جار**
**باران ڕۆح و هەناسە و هەستەکانمی تەر کرد**
**لە نێو تابلۆیەکی عەبەسیدا**
**من و تۆ و باران**
**لە قەد و بالآی یەکتری ئالآ بووین**
**وەك لاولاوەی**
**سەر پەنجەرەی ئاپارتمانەکانی بەهەشت**
**لە نێو باوەشی یەکتری راکشابووین**
**وەك رەنگە رووتەکانی تریفە و ئاو**
**لە نێو رۆحی یەکتری دا خەوتبووین**
**وەك رەگەکانی درەخت و خاك ... !**

# نیگایەکی بەسە بۆ مردن

نەرم نەرم
بە نێو پەرژینە دۆزەخاوییەکەی قەدەر و
بە نێو هەڵچوونە شکۆفەییەکانی شەودا رەتبە
کە شیرازەی رۆح و
سیمای تاڤگە سیحراوییەکانی ئومێد دەگۆرن
نیگایەك بەسە بۆ مردن
بە نێو ئەو ئێوارە هێمنە هەنارییانەش دا رەتبە
کە مانایەك بە بەرائەتی پەپوولە و
هەناسەیەك بە باخچەکانی عەشق دەبەخشن .

**بگەڕێوە نێو /**

**وەرزە موسافیرەکانی دەریا**

**گوێ لە  ناڵەی کاتژمێرە بەساڵاچووەکانی تەمەن رابگرە**

**کە کەڤرێژن لە لاوکە حەسرەتیەکانی نامورادی**

**نیگایەك بەسە بۆ مردن**

**بە نێو وەرزە  یاخیبووەکانی زریان و**

**کەرنەڤاڵە پڕ هاوارەکانی برووسکەدا رەتبە**

**ئەی رۆحە رەهاکانی نێو خەونە شووشەییەکانی ئایندەم**

**وەرە شیلەی گوڵە شلێرییەکانی خەیاڵم هەڵمژە**

**کڵپەیەك بە راموسانیە شیرینیەکانی نێو شیعرەکانم ببەخشە**

**ئەی شۆخ /**

**ئەوانەی لەگەڵ ئێمەدا سەمایان کرد**

**هەموویان مردن .**

**ئەوانەی لەگەڵ ئێمە ,**

**لە نێو وەرزەکانی قەدەر ئایەتی یاخیبوونیان خوێند**

**هەموویان مردن .**

ئەوانەی لەگەڵ ئێمە ,
لە نێو فرینە سپیەکانی هەور خەم و یاداشتەکانی
عەشقیان نووسییەوە
هەموویان مردن .
فریای چوونەوە نێو
زیکرە گەرمەکەی / کەرنەڤاڵی عاشقان و مژینی مەمکە
گەنمییەکانی
کچە کۆچەرییەکانی فیردەوس نەکەوتن ... !
ئەی رۆحە نەسیمیاوییەکەی پاییز ..
هێور هێور ,
بگەرێوە نێو بەهەشتە هەمیشە بژوێنیەکان و
لە جوانی خۆزگە سەرمەدییەکانت بروانە
خەمەکانت بە ناسکی شنەی با و
رازەکانیشت بە باران ببەخشە
نیگایەك بەسە بۆمردن
بە نێو چاوەکانی پەلکە زێرینەدا رەتبە
بگەرێوە نێو ماڵە تاریکەکانی خۆرەتاو

ئەی شۆخ /

منیش لەگەڵ خۆتدا بەرە

لە نێو دیوانە شیعرێکدا هەڵم بگرە

بمبەرەوە نێو سێبەری دوای نیوەڕۆیە

گەرم گەرمەکانی خۆشەویستی .

لە نێو بێشکەی منداڵیم دا

لە ژێر دار هەنجیرێك رامهەژێنە

وەرە بمبە و

لە بێو ماڵە تاریکەکەی نیشتیمانم جێم بهێلە

بە ماچ و گوڵەکانی عەشق داملپۆشە

بم سپێرە بە قەدەری ئاو و

بە سپیدە نارنجیەکانی سەوزایی

وەرە ئەی شۆخ /

منیش لەگەڵ خۆتدا بەرە

لە نێو نیگا گەرمەکانی زەردەخەنەت هەلم بگرە

لە نێو شەقامە گرگرتووەکانی ئاوەدانی جێمبهێڵە

**به هەناسە و بە رەهێڵە ئەبەدییەكانی عەشق دامپۆشە**
**بم سپێرە بە قەدەری خەونە برینداره‌كان و**
**بە شەوگارە رووناكەكانی ئاوێتەبوون**
**دەوەرە دەی بمبەرەوە ,**
**نیگایەك بەسە بۆ مردن / ئەی شۆخ ... !**
**نیگایەك بەسە بۆ مردن ... !**

**تەمموزی** 2006

# تارمایی ژنێکی سپی

**شەوەکان ڕەت دەبن**
**منیش / لە کەژاوەی مردن**
**دوور دەکەومەوە .**
**ڕۆژەکان ڕەت دەبن**
**تارمایی ژنێکی سپی**
**لەباخچەکانی تەنیاییم نزیك دەبێتەوە**
**سەدەکان ڕەت دەبن**
**شەقامەکان پردەبن لە گومان**
**وەرزەکانی**
**نێوان من وخەونەکانی**
**نێو تارمایی ژنێکی سپی**
**پردەبن لە ترس**

دووریەکانی
نێوان من و دەریاکانی
نێو تارمایی ژنێکی سپی
پر دەبن  لە عەشق

هۆ ژنە گیاییەکەی
نێو تارماییە سپیەکانی بەفر و
نێو خەیاڵە گەرمەکانی
شەوە شیرینیەکانی  شیعر
منیش لە چاوەروانی تۆدا
لە نیو یادگاریەکانی درەخت و
گریانەکانی بەرد و
شەوە مۆماویەکانی مانگ دا
بەدیار
چەند وینەیەکی پڕاوپڕ لە روانینی پەپوولەیی
بە رێنوسە نارنجیەکانی خەفەت
رۆمانەکانی عەشق دەنووسمەوە

**منیش /**

**لە چاوەڕوانی تۆدا**

**لە نێوشەوە مانگەشەویەکانی**

**نێو چاوەکانی ماسی و**

**لە نێو خەونە پاییزییەکانی کات و**

**لە نێو بالکۆنە فێنکەکانی خۆرەتاودا**

**بە دیار چەند کتێبێکی پڕاوپڕ**

**لە بازنە نەغماویەکانی غوربەت**

**حەسرەتە نارنجیەکانم دەنوسمەوە**

**شەوەکانم ڕەت دەبن**

**تارمایی ژنێکی سپی**

**لە سەرسینگی مۆنالیزای تەمەنی من**

**دەردەکەوێ و**

**وێنەی کۆدەکانی عەشق و**

**زەردەخەنەیەکی پڕ لە سیحرم بۆ دەکێشێ**

**ڕۆژەکان و وەرزەکان و سەدەکانم**

**ڕەت دەبن**

تارمایی ژنێکی سپی
له مردنه ڕۆمانسیەکانم
نزیك دەبێتەوە
نزیك  نزیك  نزیك
چاوەکانی لەسەریەك دادەنیٚ و
له نێو بازنەکانی بیٚ دەنگیدا
دەگرییٚ و  دەگریٚ و  دەگرییٚ
منیش له چاوەروانی
شەوێکی شیرینی نێوباوەشی ئەو ژنەدا
ئێوارە ئەسمەرییەکان و
وەرزە وەنەوشەییەکان و
مانگه مۆماویەکانم.......دادەگیرسێنم
منیش له چاوەروانی
مژینی لێوە ناسکەکانی ئەو ژنەدا
له سەر سینگی مۆنالیزای خەونەکانم
وێنەی  ژوورێك و سیسەمێك و مۆمێك
لەسەرئاوێنەی روون روونەکانی خەیاڵیشم
وێنەی سێوێکی سوور سوور دەکێشم

رۆژەکانم ڕەت دەبن
لە نێو ڕووخسارە نارنجیەکەی یادەکانم
سەبەتەیەك پر لە مێوەو
دەلاقەیەك پر لە کتێب و
گوڵدانێك پر لە گوڵ
سەمام بۆ دەکەن و لەئامێزم دەگرن
وێنەی شەوێکی شیرینی پر لە شیعرم
بۆ دەکێشن
شەوێکی پر لە باران و
پر لە هاوار و پڕ لە شەپۆڵ و پڕ لە فرین

رۆژەکان و شەوەکان و سەدەکانم
رەت دەبن
تارمایی ژنێکی سپی
لە سەر سینگی مۆنالیزای هەناسەی من
دەردەکەویَ و
دێتە نێو کێڵگە سپیەکانی ڕۆحم

**بە نێو کۆڵانە کچێنیەکانی**

**دەمارەکانی عاتیفەم پیاسە دەکات و**

**بەسەر پەیژەکانی خۆشەویستیم / هەڵدەگەڕێ**

**لە نێو کازێوەی گلێنەی چاوەکانم**

**رادەکشێ**

**بۆ هەتا هەتایە /**

**لەوێدا دەمێنێتەوە**

**وەرزەکانی من رەت دەبن**

**منیش لە چاوەڕوانی**

**شەوێکی شیرینی نێو باوەشی ئەو ژنەدا**

**لە سەر سینگی مۆنالیزای برینەکانم**

**بە " کۆدەکانی داڤنشی "**

**وێنەی چەمانەوەی خۆم دەکێشم**

بۆ هەتا هەتایە
لە نێو فڕینەکانی عەشقێکی ئەبەدی
لە نێو /
خەیاڵە بەفرینییە کریستاڵییەکانی تەنیایی دا
دەمێنمەوە
کتێبێك پڕ لە شیعری عاشقانە
بە ڕێنووسە نارنجیەکانی غوربەت
بۆ نیگار و
بۆ ڕووخسارە ئاوێنەییەکەی
ئەو ژنە سپیە لێو بەبارە / دەنووسمەوە .

سیبتەمبەری 2006

# ( سێرنادا ) *

**هەموو ساڵێك لەو دەمەدا**
**لەگەڵ هەناسەدان و چاوهەڵهێنانی**
**یەكەم شەوی نێو مەمكۆلەكانی مێژوودا**
**لە نێو ماڵە تەنیاییەكەی بەفر**
**بەدیار فرمێسكەكانی مانگ و**
**زەردەخەنەكانی ئاگردا**
**شۆرە ژنێكی خەیاڵ بەنەفسەجی**
**لە ژێر تارای /**
**تاسە زەنگیانەییەكانی عەشق و**
**لە نێو كات ژمێرەكانی سەوزایی دا**
**گوێ لەسێرنادای مۆم رادەگرێ**

منیش هەر لەوشەوە رەوشەنیەدا
نەرم نەرم لەنێو رامانە زایەندی یەکانم
مەست مەست /
کۆڵانەکانی غوربەت و
یادگارییەکانی مردن و
بەلەمە نەوەزییەکانی قەدەر / جێدەهێڵم
دەگە رێمە وە
نێو کەژاوەی راموسانی و نێو پەرستگەکانی پاکبوونە وە
لە وێندە رێ
لە نێو ماڵە رەبەنیە کەی باران
ئاگر لە جانتای سەفەر و
لە پەراسوەکانی تەنیاییم بەردەدەم
بەدەم خوێندنەوەی ئایەتەکانی عە شق و
میلۆدە هەنارییەکانی سێرنادا دا
پێکە گێلاسە ییەکانم هەڵدەدەم

بەرەو قوڵاییەکانی دەریای توانەوەو
بەرەو مەتارێزی /
زایەلە زێرینەکانی زەردەپەر
شۆردەبمەوە
بە رەنگە خۆلەمێشییە خەملیوەکان و
هێڵە شەپۆلاویيە لماوییەکانی
نێو تابلۆیەکی زەیتوونی بێ ئۆقرەی خوماریدا
لاوکەکانی تەنیایی و
وەرزەکانی خۆرئاوابوونم / رەنگ دەکەم
هەر لەو دەمە
لە یەکەم شەوی لە دایکبوونی عەشق
لە نێو خەونەکانی
گوڵ و ئاوێنە و شمشال دا
بە دیار بزە گەرمەکانی رەشەبا و
سێبەرە رووتەکانی ئەستێرەدا

**به دەم سووتان و**

**ئەندێشە نخرۆییەکانی نوێژی شێوان**

**لە گەڵ خۆم دا**

**شەنگە شلێرییەکانی شەو و**

**کڵپە کچێنییەکانی کرێوە و**

**سروە سروشییەکانی سەحەر / بە سەما دەهێنم**

**تا خەونە وونبوەکانی**

**نێو دەمارە ووشك هەڵاتوەکانی ئارەزووم**

**تەر تەر دەبنەوە**

**وەك رەیحانە رەشەکانی / نێو رۆحی شەونم و گیا**

**سەما سەما سەما**

**لێرە سەرسامی و لەوێندەرێ سەما**

**لێرە فرمێسك و لەوێندەرێ فرین**

**لێرە حەشیشە و لەوێندەرێ عەشق**

**سەما هەمیشە سەما**

**فرین هەمیشە فرین**

**عەشق هەمیشە عەشق**

**هەموو ساڵێك لەو دەمەدا**

**لە نێو مەریەمیترین عەشقی خودایی و**

**لە ژێر ڕەشماڵی بنار خەیاڵە تاوسییەکان دا**

**بە تاسە مەرجانیەکانی گەردنی ئاگر**

**گویٚ لە سێرنادای عەشق ڕادەگرم**

**لەوێدا / لە نێو هەناسە گەرمەکانی ئەو شەوە دا**

**دەمێنمەوە / دەمێنمەوە / دەمێنمەوە**

**خۆم بە عەبەسیەتی**

**تاڤگەکانی عەشق و نافورەکانی میهر دەسپێرم ... !**

کۆتایی کاتژمێرەکانی 2006

* سێرنادا / پارچە مۆسیقایەکی خۆشەویستییە

# نیشتمانە سپیەکەی نێو خەونەکانی دایکێ

لە نێو هەناسەی
وەرزە مەستەکانی رەبەنیترین موسافیر
ڕەنگە کان ,
بیّ رۆح.....بە ئەسپایی
بەسەر شەقامەکانی مەرگ
ڕادەبوون .
بەرەو چارەنوسێکی نادیار
وون وون دەبن
تێکەلّ بەهاوارە تە نهاییەکانی
بیّ ئارامترین بالّندەکانی خودا دەبن.
بە ئەسپایی
بە دەوری ڕەبەنیترین
ئە ستێرە سپییەکانی خەون
دە سوڕێنە وە .

**موسافیرەکان ,**

**لە ژوورێکی تەنیا /**

**لەگەڵ گەڵاکانی تەنیایی دا**

**دەلەرێنەوە ....**

**لە گۆڕێکی تاریك /**

**لەگەڵ گەردەلوولەکانی تاریکیی دا ,**

**ژووان دەگرن.**

**ڕەنگە کانیش بە ئەسپایی**

**لە نێو یادەوەرییەکانی باخچەکان وون دەبن.**

**ئەو باخچانەی**

**پڕاوپڕن لە نائومێدی**

**ڕەنگە کان بە ئەسپایی /**

**لە نێو ڕوناکیە بێ ئومێدییەکان**

**خۆرەتاودا پیاسە دەکەن .**

**نامورادا نە**

**لە نێو خەونە ڕەبەنیەکاندا دەمرن .**

**بەر لە مردن /**

وەسیەتەکانیان
لە نێو جانتای موسافیرە غەریبەکان جێ دەهێلین.
ئەو موسافیرا نەی
جانتاکانیان پڕاوپڕە لەخەوە سپیەکانی گەڕانەوە .
پڕاوپڕە
لە شیعرە چاو بە فرمێسکە کانی
نێو ژوورە چۆڵ و هۆڵەکانی غوربە ت

ئەو موسافیرا نەی
گوڵە لۆتسیەکانی رۆح یان
ڕەیحانە ڕەشەکانی هەناسەیان .
بۆنی غەریبی‌یان گرتووە.
تەمەننای بینینەوەی نیشتمانە سپیەکەی
نێو خەونەکانی دایك دەکەن .
موسافیرەکان ،
تاهەتایە لەنێو دەریاکانی غوربەت دا دەمێننە وە

**لەنێو کۆڵانە تاریکە کانی زەمەن دا  وون دەبن**
**لەپەنجە رەکانی تەنیایی**
**سەیری خۆرئاوابوونەکانی تەمەن دەکەن.**
**لەژێر سێبەری دارسنەوبەرە کانی ئاو**
**بە تەزبێحە گوڵ گولێنەکەی باران**
**وەرزەکانی نێو فرمێسکەکانیان دەژمێرن.**
**ژنەکانی نێو پەلکەزێڕیینەی خەیاڵ یان**
**بە پەرتبوونەکانی /**
**نێو باخچەی نائومێدی یەکان دەسپێرین .**
**ئەوە منم /**
**کەرنە ڤالێك لەشەپۆڵەکانی مردن**
**هاوارێك لەسێبەرەکانی تەنیایی**
**مۆسیقایەك لە ئاوازە ناسکەکانی وون بوون .**
**بەسەر گۆنای لاولاوە ڕەنگ زەردەکانی**
**نێو چاوەکانم دەبیندرێ .**

ئەوەمنم / شانە سڕەکانی پەنجە کانم
پڕبوون لەپەرستگا خوداییەکانی غەریبی
پەیکەری ئومێدەکانی خەیالم
هەموو بەیانیان ،
خوناوە خەملیوە خەماوییەکان دەردەکەن
ئەوەمنم /
ڕۆحێکی شەکەت و ماندووی
ڕێگا وونەکانی غوربەتم .
لەژێر تەرزە ڕەشەکانی شەو
خۆشم نازانم بەرەو کام مەنزڵ ڕێ دەکەم .

دێمەوە /
دێمەوە.....دێمەوە.....دێمەوە
پیاسەکانم دەست پێ دەکەمەوە
لەژێر باران و تریفە
خەمە شمشالییەکانی بروسکە بەسەر دەکەمەوە
لەژێر کەپری ڕازە هەنارییەکانی ڕوناکی
ڕادەکشێمە وە

**هاوارەکانی دەریا هێور و**

**گوناهەکانی مانگ سپی دەکەمەوە .**

ئەوە منم / دێمەوە ،
لەبنار کانیەکانی عەشق
دەگێرسێمەوە .
بۆ گوڵە حاجیلەو خالخالۆکە پرتەقالیە کان
دەنوشتێمە وە .
وەکو جاران.....
گوێ لەسەمفۆنیای ڕووبارەکان و
گوێ لە لاوکەکانی خاك / دەگرمەوە
لەگەل نەوڕەسەکانی بەر باران
پڕ بەسیەکانم هەناسە دەدەم
لەگەڵ تاوسە جاویدانیەکانی ئەڤینداری
سترانە هێمنیەکانی هەور دەچڕین .

دێمەوە /
خۆم لەجوانیەکانی گەلاو
لەڤینۆسیەتی بەفر وەردەدەم
لەنێو خۆڵەمێشی خەونەکانم دەگەوزێم
لەنێو شەپۆڵە شاگەشکەییەکانی مەست بوون
تائەبەد ناڕۆمەوە....!

نیسانی 2007